ناوی نامیلکە: ئاخ کوردستان
ناوی نووسەر: کازم کۆیی
تایپ: هەڵۆ کازم
دیزاینی ناوەرۆک: سۆران تاودەر
ساڵی چاپ: ٢٠٢١ بوونی
ژمارەی سپاردن: (٥) ساڵی (٢٠٢١)ی دراوەتێ.
تیراژ: (٥٠٠) دانە

## پێشەکی

خـوێنەرانی بەڕێـز، هیـوادارم هەردەم سـاغ و شـاد و بەختەوەر و سەرکەوتووبن لە ژیان...

بەڕێــزان.. ئەم چەنــد دێــڕ و کــۆپلە هــۆنراوانەش بەناونیشانی (ئاخ کوردستان) دیـارییە بـۆ بەڕێزتـان و حەزم کــرد لە کــاروانی هۆنراوەکــانم و دیــوانەکەم دانەبــڕێن کە لە داهــاتوو خــودا یــاربێ بەهاوکــاری دڵســۆزان چــاپی دەکەیــن... لەگەڵ ڕێزمانــدا و هەر بژین...

**پێشکەش بێت بە گشت دڵپاک و دڵسۆزانی گەل و نیشمان**

کازم کۆیی

٢٠٢١/١/٧

دەرزی بـکە بە خۆتـا ئینجـا سـوژن بە خەڵکـا
دارو بەرد یەکتری گرت کورد هەر پێکەوە نەلکا

٢٠١٩/١٠/١٤

ئاشـــــــکراو ڕوونە هـــــــیچ رامەمێـــــــنن
مێـــــرووله یەکـــــبن فیـــــل دەبەزێـــــنن

٢٠١٩/١٠/١٤

# خەم

لەگەڵ خەمان خەم داتنەگرێ
چاو تەم نەگرێ خوا دەتگرێ
ئەی بۆ زیڕەی مناڵێ بێ
کە برسییەو تازە پێدەگرێ
یا بۆ پیرێ کە نەتوانێ
بە گۆچانیش خۆی ڕابگرێ
یا بۆ دایکێ کە بۆی نەکرێ
نازی مناڵی هەڵبگرێ
ئەم دڵە چۆن ڕاناوەستێ
کەسەرسامم بەرگە دەگرێ

٢٠١٩/١٠/١٥

## سۆزێك بۆ مامۆستایانی خانەنشین

مامۆستایان من قوتابییەکەی بەردەستی ئێوەی جارانم
بەختەوەرم کە گوێ دەگرن بۆ چەند کۆپلەی شیعرەکانم

مامۆستا سایەی سەرمانن خۆری گەشی نیشتمانن
بێ مامۆستا هەموو شوێنێ چۆڵ و بیابان و وێرانن

ئێوە بیرمەندو فەرهەنگ و چراو مۆمی ڕێگەی ژیانن
نە خوێندەوارن ئەوانەی نرخ و بە هاتان نازانن

دەبێ ئێوە سۆز نشین بن لەناو گوڵزاری نەخشین بن
هەر ئاوێنەی نەوەکان بن ئاڵای شەکاوەی بەخشین بن

٢٠١٩/٩/١٩

## سڵاو

سـڵاو لە گیـانی ئەدیسـۆن زانـای رۆشـن
سـڵاو لەوانەی بـۆ ئاشـتی تێدەکۆشـن
زانست ئەمڕۆ وا پێشکەوتووە نێر دەدۆشن
بازرگـانیش هێنـد بەهێـزە گەل دەفرۆشـن

٢٠١٩/١٠/٢١

## هاواری کورد

هـاواری کـورد لە هەر کـوێ بـێ یەك ئـاوازە
ژیـانی کـورد بـێ ئەنـدازە پـڕ لە ڕازە
جـێگەی داخە کە ناتەبـاو لانەوازە
هەتـا ئێسـتا و لە سـەردەمی کـۆن و تـازە
کەسەرسـامم کـۆتری بەرچنگـی بـازە

٢٠١٩/١٠/٢١

## پرسیارێکی بەردەوام

پرســیارێکی بەردەوامە بــۆ ئەوەی گەلە سەربەســتە
کەچی ڕێگەی خەباتی کـورد بـۆ سـەربەسـتی پـڕ بەربەسـتە

زۆربەی دەڵــێن ناتەبــایەو نە یەك دڵەو نەیەك دەســتە
هێندێ دەڵێن هەردەم بەمەی زلهێـزان بـێ هـۆش و مەسـتە

پێشیان وتـراوەو دەوتـرێ بـرا پشـتیان پـێ مەبەسـتە
ئەوانە بەرژەوەنــدخوازن بە لێنیــان تیــغ و مقەســتە

ئەی چارە ، من دەڵێم ئەگەر نەبێ بەیەك هێزو جەسـتە
تا ژیان ماوە داماو دەژی ، ژێردەسـتەو بـێ مـاڵ و خەسـتە

٢٠١٩/١٠/٢٣

مەل لە فڕین و لە هاتنەوەی چاوی بەزۆر شوێن دەکەوێ
گەرنا بەجێ و نارێکیش بێ هەر هێلانەکەی خۆی دەوێ

٢٠١٩/١٠/٢٦

دڕك هەر دڕکە هی گوڵ بێ یاقەدو لقی هەر درەختێ
دوژمن هەردوژمنە برا لەهەر شوێن و سات و وەختێ

٢٠١٩/١٠/٢٨

## (ئێمە و دوژمن)

دوژمن بـوونی نـیە بـرا گەر خۆمـان یەك دەنـگ و هێـزبین
هەر هەمووموان بە دڵ بە گیـان هەردەم گەل و خـاك و پـارێزبین
٢٠١٩/١٠/٢٩

## (گریانی جودی)

جودی گریا وتی حەیـفە لە دونیـا یەکەم مـیللەت بـین
لە پێش زایین بە حەوت سەدساڵ لە ئەکباتانا دەوڵەت بـین
جێگەی داخە هەتا ئەمڕۆ بێ خاك وئاڵاو لەت لەت بـین
سەیرە دەبێ بۆچی هەردەم ئاوا بێچارەو نەگبەت بـین
یا لەژێر تۆپ یا لە زیندان یا مل لەناو بازنەی پەت بـین
٢٠١٩/١٠/٩

بەڵێ لەگشت وەرزو کـاتێ عەقـڵ چەترێکـی زۆر باشـە
بەڵام ئەگەر کـراوە نەبــێ تــا هەی هەبــوونی بەلاشــە
٢٠١٩/١١/٩

## بۆ یادی (٧١)ساڵەی کۆچی دوایی
## (دڵداری) جوانە مەرگ

حەفتـــاو یەك ســاڵ بەرلە ئەمـــڕۆ
دڵـــــداری نەوەی شـــــاری کـــــۆ
لە پـــاڵ قەڵای هەولێـــری جـــوان
دەکەوێ جەســـــتە پـــڕ لە ژان
وا دەزانـــــن کە سەرخۆشـــــە
کەســـێ ئاســـایی بـــێ هۆشـــە
لەبەر ژان و زمـــــان گیرانـــــی
بە داخەوە کە نـــــــــــاتوانی
بڵـــــێ کەمـــــن پـــــارێزەرم
مـــــن دڵـــــدارم کـــــورد پەروەرم
دەیـــــخەنە نـــــاو عارەبـــــانە
دەیـــــبەن بەرەو پـــــۆلیس خـــــانە
کەس لە دڵـــــدار نـــــاپێچتەوە

لەتـــاو ئـــازاری دەتلێـــتەوە
لەبەر ســـــەرماو لەبەر ژانـــــی
هەر ئەو شـەو دەبەخشـێ گیـانی
ســـڵاو لە گیانـــت پـــارێزەر
گەل و خـــاك و مــــرۆڤ پەروەر
جـــوانە مەرگـــی خۆشـــی نەدی
تــا ژیــان مــاوە چــرای کــوردی

٢٠١٩/١١/١١

## کوردستان

خـــوایه کوردســـتان ئـــاوابێ
هەوری خەمـــی لـــێ ئـــاوابێ
کـــورد چـــۆنی دەوێ ئـــاوابێ
نەك تـــا ژیـــان مـــاوە ئـــاوابێ

٢٠١٩/١١/١٢

## (زامی کورد)

لەنـــاو مێـــژوو گەڕام ورد ورد
بـــۆ زامەکـــانی جەســـتەی کـــورد
نـــیه جەســـتەی ئـــاوا پـــڕ زام
لە کـــــۆنترین بـــــرین گەڕام
ســـەیرم کـــرد هێشـــتا بەســـۆیە
دەڵێـــــی برینـــــی ئەمـــــڕۆیە

٢٠١٩/١١/١٥

## توندو تیژی

ئەم دوو وشە کەم بیستراوە لەناو کورد
هەر هاوژین بوون نێرو مێ درشت و ورد
گەلێ ژن بۆ شۆڕش و ژیان بوون بە پرد
زۆر پیاو ناوی بەناوی دایکی دەرکرد

٢٠١٩/١١/٢٧

## (کوردە یەکبن)

ورد بـــــــڕوانن یەکـــــــبن کـــــــوردە
ڕۆژێ نەخشــــــــەو بیــــــــری وردە
لەنــــــاو چوارچێـــــوەی ئـــــاگری
نـــــابێ چـــــرکەك چـــــاو داگـــــری
بەیەك هێـــــزی خـــــۆ ڕادەگـــــری
خـــــاك و مافـــــت وەردەگـــــری

داری ڕەنجـــــــــت بەردەگــــــــری
ئــــــاوارە نــــــابی و نــــــاگری
دەنــــــا دڵنیــــــابن دڵنیــــــا
بـــــێ حــــاڵن تامـــــاوە دونیــــا

٢٠١٩/١١/٣٠

## نەهاتی

فەوتـــــا تـــــا ڕێـــــی دڵـــــی بـــــڕی
بەدڵ نــــــاخی بــــــۆ دەر بــــــڕی
ئــــــاخ کــــــاتێ ســــــەری هەڵبــــــڕی
بەیەك (نـــــا) چـــــۆن جەرگـــــی بـــــڕی
مەلـــــی ئـــــاواتی ســـــەر بـــــڕی

٢٠١٩/١٢/٨

# کەری هاوکار

زۆر کەس نانی جۆ دەخوات و ئاوی جۆش زۆر دەخـواتەوە
زۆر حەزیشـــی لەنـــاو گیـــایە دابنیشـــێ و پاڵـــداتەوە

لەکـــار مانـــدوو تـــرە لە کەر بـــاری زۆریـــش دەبـــاتەوە
تورەش دەبێ پێی بڵێی کەر چـاوت لـێ زەق دەکـاتەوە

تــۆ ســەیری کەر لە بـــوونەوە ئـــاوڕ لە بـــرنج نـــاداتەوە
تـــازە مـــرۆڤ بیـــر لەنـــان و لە ئـــاوی جـــۆ دەکـــاتەوە

هێمای ژیری و هۆشمەندیە کاتێ بەکەر دەوترێ هـۆش
زوو دەوەستێ بەڵام زۆر هەن پێی بڵێـی هـۆش جـا دەڕواخـۆش

کەر هاوکـاری مـرۆڤ بـووە هەر لە ســەرەتای ژیـانەوە
زۆرن ئەوانەی بەهـۆی کەر خەنـی بـوون و حەسـانەوە

٢٠١٩/١٢/١٠

## سەیرە

سەیرە تۆ چۆن لە ئاوێنە قسەك لەگەڵ خۆتا ناكەی
ناپرسی با درۆ بەس بێ و دزی و گلدانەوە تاكەی
ئەرێ جارێ تۆ سەردانی گۆڕی ئازیزانت ناكەی
بێیەوە هۆش و بزانی كەتۆش خۆراكی ئەم خاكەی

٢٠١٩/١٢/١١

نرخ و بەهای تیشك و چرات هەر لەیادبێ لە ڕۆژی ڕوون
كە چۆن هانایان بۆ دەبەی لە تاریكی و خۆر ئاوابوون

٢٠١٩/١٢/٢٣

## بۆشاری کۆیەی خۆشەویست

شـــــاری هــــونه ر زانـــــاو مه قــــام
خــــاوه ن پــــێگه و نـــــاو و مه قــــام
پــــارێزگه بــــێ پــــێش قایمقــــام
حه یــــفه بــــۆ کــــۆ وابــــێ شــــه قــــام

٢٠١٩/١٢/١٤

## ئاخ کوردستان

له ڕاپه ڕیــــــن لەنـــــــاو لانکــــــــی
ئێســـــتاش له نــــاو چـــــۆغه و ڕانکــــی
خــــاوەن کۆشــــك و چه کــــی بــــانکی
کــــاره بــــا فــــول نه وت به تــــانکی
خــــواردنی چــــاك هه تــــا وانکــــــی
بڕیــــــار ده دا له ســــــەر ژیــــــانم
ئــــاخ چــــۆن نه مــــرم کوردســــتانم

٢٠٢٠/١/١٢

وە رە فلسێ هـی خـۆت نە بـێ کاسبیشـت نە کردبـێ
جە رگت بێ لانە و برسی بێ سە رماش هیلاکی کردبێ
مـن نـازانم دە بـێ پێشـتر کە سێکیان لـێ نە مردبـێ
کاتێ مردوون دە بێ ئە وان چیـان لە گە ڵ خـۆ بردبـێ

٢٠٢٠/١/١٤

گەرمە باسـی دادپەروە ری و یاسـاو یەکسـانی و پاکسـازی
قوربـانە دادوەرو قـازی دەی سـپیکەن وەکـو پیـازی

٢٠٢٠/١/١٥

پە پووولە کە دڵی نیە هە ست و جووڵە ی هێندە جوانە
کە سـێ نـیە خۆشـی نە وێ و ئـازاری دا لە م جیهـانە
٢٠٢٠/١/١٧

پڕگاڵ سێگۆشه دروستکاو ڕاسته ش هێڵی خوار بکێشێ
له ناسنامه ی گیانله به ران مێش بنووسرێ به گامێشێ
دووڕووو به رگی ڕاستی بپێنێ و له بالآی درۆی هه ڵکێشێ
ئاخر چۆن خه م داتناگرێ و سه رو دڵت چۆن ناهێشێ

٢٠٢٠/١/١٨

لەگەڵ ژ یــرێ له بەنــدابی نەك لەگەڵ نەفــام له بــاخێ
له دەوارێ بەدڵ بــژی نەك له کۆشــکێ پــڕ له ئــاخێ

٢٠٢٠/١/٢١

چەنــدان زانــا له ژیانــا گرفتــاری هەســت و مێشــکن
بێــدارو دڵ به ئــازارن به ڕۆژ و شــەو هەر له ئێشــکن

٢٠٢٠/١/٢٨

# (پیاو) و (ماڵ)

پیـــــاو نـــــازانێ لە مــــاڵ بە چـــــی بنـــازی

بـێ مـووچە و کـارە بـا و بـێ نە وت و غـازی

هە ریە کێکـــــیش رۆژێ شـــــتێ دە خــــــوازی

ســـە رســـامی چـــۆن مـــاڵە وە بـــکە ی رازی

بـــــازو شـــــێر بـــــی وە ك مـــــامزی لاوازی

خـــۆت مـات نە کە ی کـار دە گـاتە لای قـازی

بمبـــوورە خـــانمە کە م لە دنیـــا تـــۆ شـــازی

هـــــاتم هـــــاتم قـــــازی بـــــۆ لات هــــــاتم

تاوانبـارنیم چیم نە کـردووە لە مـاڵێ هە ڵا تـم

لە گەڵ رێـزو خۆشەویسـتیم بـۆ هونەرمەنـدی گەورە و دیـاری کـورد مامۆســـتا (عـــومەر رەزا) ئەوەنـــدە ئەم گـــۆرانیەو ئەم ئـــاوازەم لاخۆشەویستە بۆیە بەم شێوەم نووسی (بمبوورن) ٢٠٢٠/٢/٢.

به قورئـان و به میـژووو یه که م خـاك و مـیلله ت بـی
جـا له دووو هه زارو بیسـت ژیانـت ئـاوا سـه قەت بـی

٢٠٢٠/٢/٣

ئەو کەســـــانەی لە گەشــــەی کـــــورد رێگـــــرن
شـــــــاکۆڕۆنان لە کۆڕۆنـــــــا پیســـــــترن

٢٠٢٠/٢/٤

بـــــوتڵێ عـــــارەق بە بـــــوتڵێ غـــــاز پێکەنـــــی
بەم قورســـــــیەی لە تـــــــریقەی راچەنـــــــی
ووتـــــی چـــــیە بـــــۆچی ئـــــاوا دڵخۆشـــــی
ووتـــــی تـــــا مـــــن پـــــڕبم تـــــۆ هەروا بۆشـــــی

٢٠٢٠/٢/٤

لافـــــــــاوی درۆ بەردەوامە و راناوەســـــــــتی
رۆژ لە دوای ڕۆژ زۆرتـــــر دەبــێ تەرمـــی ڕاســـتی
٢٠٢٠/٢/٦

تەمەن لێـــرە قەپـــانێکە ســـفرە هەمـــوو ژمارەکـــانی
مناڵ بێ گەنـج بـێ یـا پیربـێ یەك پێـوەرەو سـفرە ژیـانی

٢٠٢٠/٢/٦

ســـروودی (بـــرنج) ئەمـــرۆکە ئـــاگری کـــردۆتەوە
(ئەی ڕەقیب) و (ئەی شەهیدان) دەڵێـی لەبیرچـۆتەوە
(بریـــانی) لە (جەرگ بریـــان) خەڵاتـــی بـــردۆتەوە
بەداخەوە بـــۆ (هـــونەر) لە مەنـــجەڵ قـــاڵ بـــۆتەوە

٢٠٢٠/٢/٨

ســـامانی دونیـــا هـــیچە بـــێ ئاســـوودەیی دەروون
پاشـــــایەتی لەشـــــەوا مـــــردنە دوور رۆژی روون
٢٠٢٠/٢/٨

شێتیش ئەگەر لێی بگەڕێن ژینگەکەی خۆی جێ ناهێڵێ
مرۆڤی ژیر بێزار نەبێ چۆن دەریای ئیجە دەکێڵێ

٢٠٢٠/٢/٩

قوتابییەکم باسی خۆی کرد زۆر بە خەمباری و ڕەشبینی
ووتم نا تۆ زۆر خۆشبەختی کە مەرگی زاڵمان دەبینی

٢٠٢٠/٢/٩

زۆرن بە رووی وێنە دەگرین بریا مابای لەناومان بای
ژیرۆ مەگری ئەتۆش دەمری دە تا مابوون بۆیان چابای

٢٠٢٠/٢/٩

زۆر ئەستەمە مێشێ فێرکەی شیلە بمژێو عەشقی گوڵ بێ
خۆ گەر هەنگیش مامۆستای بێ دەبێ تووشی جەڵتەی دڵ بێ
٢٠٢٠/٢/٩

## بەڵێ بە ڵێ دایە وایە

بە ڵێ وایە

هە ردەم دایە

لەم دونیایە

دیاری خوایە

بەڵێ دایە

خەوی نایە

تا یەك منداڵ بە ئاگایە

بەڵێ دایە

ئۆخەی نایە

تا منالێ برسی مایە

بەڵێ دایە

کە سەرمایە

لێفەی خۆشی

بە جەرگی دایە دادایە

دە تامایە

که شادی له سایه ی دایه

خزمه تی که و بلێ خوایه

ساغ بی و تەمەنداربی دایه

چونکه کاتێ نه ما دایه

جاده زانی ئەم دونیایه

که چه ند چۆڵه و

ژیان هیچ تامێکی نەمایه

٢٠٢٠/١/١١

حـوكمەت فريـاى مـۆزەف كەوە  وەكـو بـابێ وەكـو كـوردێ
هەمووى وا ئاخ هەڵدەكێشێ بۆ مووچەو ئيكـراميەى پـردێ

٢٠٢٠/٢/١١

مـووچەت رانــى بەرخ بـێ و بيــبەى بـۆ  خانەنشـينى
وەى كە ســەيرە لە كۆتــا بەس ئێســكەكەى دەبينـــى

٢٠٢٠/٢/١٢

بەشــــــەو عێــــــراقين بە رۆژ ســــــەربەخۆين
هەمــــــوو خەم لە نايەكســــــانى دەخـــــۆين
لەبيرتـــــان كـــــردن چەنـــــد بۆتـــــان مــــردن
ئەم كـــــــوردە مەردە چـــــــى بـــــــۆنەكردن

٢٠٢٠/٢/١٢

قەیـــران هەر بەردەوامە کــێ ژیــرەو رۆشـــنبیرە
بـــۆ نـــابێتە قەیرانـــی جـــگەرەو عـــارەق و بیـــرە

٢٠٢٠/٢/١٢

چەنـــد ســـەرمابێ ببـــارێ بەفـــر و بـــاران
نـــابتە ســـاردی نـــاو دڵ و مـــاڵ و گیرفـــان

٢٠٢٠/٢/١٤

## هەستی جوان

ڕووناکی هەست شاگوڵی ژین
مەلی جوانی ئاسمانی شین

ئەی بارانی خەندە وخۆشی
تیشکی دڵ وفەرامۆشی

دەروونت کانی سازگارە
بزەت پەپوولەی گوڵزارە

شادەماری ، دڵ بزوێنی
بووژێنەری، هەواو خوێنی

چرای چاوت گەش وجوانە
برژانگت بوینە پەروانە

ســـــايەت خۆشـــــترين هەوارە

زســـــتانيش لای تـــۆ بەهـــارە

دڵـــــت ئـــــازار مەدە گـــــوڵێ

گـــۆرانی خـــۆش بـــۆ ژيـــان بڵـــێ

بـــا ئـــێمەش لەگەڵ هەســـتی تـــۆ

گەشـــبينەوە وەچەشـــنی پشـــكۆ

١٦/٤/ ٢٠١٨

## خاک وپاک

دەبـــا قـــۆڵی لـــێ هەڵمـــاڵین
بەرگــــی گەنــــدەڵان دامــــاڵین

رێ خۆشــکەین بــۆ کەســی دڵســۆز
گشـــــت رۆژێ بکەیـــــنە نەورۆز

گەل و خـــــاک و کــــــورد پەروەر
هەســـت و پێنـــووس وەک گەوهەر

زۆرن لەم کوردســـــــــــــــتانە
گیانیـــــان لەســـــەر دەســـــتانە

ئامـــــــــادەنە هەمووکـــــــــات
پێشــــــــمەرگەبن بــــــۆ وڵات

بســــتێ خـــاکی نیشـــتیمان
نــــادەن بە هەمــــوو جیهـــان

لەگەڵ خەمـــــــی خەمبـــــارن
لەگەڵ خەنــــــدەی بەهـــــارن

بە هیــــــــوای وارێکـــــــی وا
هەربەرەو لـــــــوتکە بـــــڕوا

پـــــاک و بـــێ گەرد وئـــاوا
لێـــی رازی بـــێ گـــەل و خـــوا

٢٠١٩ /٧/٢٥

## هاوار

هاوارە لەتاوان لاڵم
حەیفە لەوەتەی هەین زاڵم
بە فسفۆر،کیمیا و ناپاڵم
دەسوتێنێ خاک ومالم
دەیەکگرن تاکەی بنالم
٢٠١٩/١٠/٢٠

## برسی

ئەگەر برسی
خۆی نەبێتە پێچکەی کورسی
کورسی نشین
دەکەوتە شین
یا دێتە ڕیزی برسییەکان
یا هەڵاتن وە یا نەمان
٢٠٢٠/٢/٢٠

ئەو دڵانەی کەوا بەنـدن لە زینـدانیان زۆرتــرن
زیندانی سەردانی دەکرێ دڵان بێکەس دەمـرن

٢٠٢٠/٢/٢١

## ئاخ

هەزاران هەسـتی ناسـک و پـاک و جـوان
پـا و دەسـت بەکـۆتن لە زینـدانی ژیـان
وەک داری پـــــاییز وا هەڵـــــــدەوەرن
ئـاخ زۆر بــێ هەسـتیش کە بەخـتەوەرن

٢٠٢٠/٢/٢٢

# کامێرای شارێک

بۆ گیانی کامێرای شار بەڕێز کاک ( قادر بەشدار )

ئەو دڵـــــــی خەبەری دابـــــوو
بـــاش دەیزانـــی کەمـــی مـــابوو

کە مەرگ گیـــــانی دەکێڵــــــێ
ئەم ژیـــــانە بەجـــێ دێڵــــێ

بۆیەدەینووســـــــــــی رۆژێ دێ
کە شاربەشـــــــــــار ودێ بە دێ

بەدوام دەگەڕێــن خەڵکـــی کـــۆ
هـــیچ دادیـــش نـــادا بەشـــدار ڕۆ

هەر ئەو نەبـــوو کە زۆر بەتـــام
نـــاو بە نـــاو دەیـــوت ئەوەتـــام

ســـڵاو لە گیانـــت کـــاک بەشـــدار
پـــەپوولەی شـــاری کـــۆی نـــازدار

چـــاوی كـــامێرای شـــارەكەم
دەروێشـــی رێـــی دڵـــدارەكەم

هاورێبـــــازی ســـــەردارەكەم
هەســـــت و دڵە خەمبـــــارەكەم

بـــێ دەســـەڵات بە گـــوڕ دەگـــرین
بۆتـــۆی خـــاكی بۆتـــۆی شـــیرین

٢٠٢٠/٢/٢٣ كات (یەك و نیوی) نیوەڕۆ

گەڕەک بە گەڕەک کـووچە بە کـووچە
دێـتە گـوێم دەنگـی بـێ کـارومووچە
بەبەرکـــی بەتـــاڵ بێـــزارن لە مـــاڵ
نـــازانن چـــی بڵـــێن بە ژن ومنـــداڵ

٢٠٢٠/٣/٢

# بەزمی کۆڕۆنا

نەدەیبینـــی نەدەیناســـی پێـــت دەوەســـتی
بەبـــێ هـــاوار لە ژووری ماڵێـــت دەپەســـتی

هەر خەم بخـۆ بێـنە سـابوون بشـۆ دەسـتی
کام خۆشەویست بێتە تەکت زوو هەڵدەستی

لەبەر تەوقە دەســت لە گیرفانــت دەپەســتی
ژیــان و جــوڵەت لەگشــت لاوە ڕادەوەســتی

لە جیهانـــا هەر باســـی مـــردن دەبیســـتی
تـۆش نـامێنی ئەگەر توشـت بـێ بە خەسـتی

لەتـاو سـەیران بـێ هەوەس ومـات وپەسـتی
دوور لە گەشــتی بەدەردی کۆرۆنــا مەســتی

٢٠٢٠/٣/١٥

کەناڵەکان هەموو داخەن بیکەن بە یەک کەناڵی کورد
سەرسامین گوێ لە کام بگرین هەموومانیان وڕ و گێژکرد

٢٠٢٠/٣/١٥

خۆزگە وەک ساڵی شەستەکان بە گەڕەکێک یەک رادیۆبا
تا چاو دوور تیشکی زیانبەخش وگوێ دوور هەواڵی درۆبا

٢٠٢٠ / ٣ / ١٥

زەمانێکە لەم وڵاتە عەقڵ کەرەنتین کراوە
لەچ بوارێ کەی پرس و ڕا بە مرۆڤی عاقڵ کراوە
یەکەم مرۆڤی سەرزەوین چ بە مێژوو چ بەئایین
بەداخەوە لە کۆتایین خەریکی مەشخەڵ وشایین
دەردوخەمی بێ مووچەیی و بێکاری و بێ نیشتمانی
هەرباس ناکرێ زۆر گرانە هەر بەراستی کوشتمانی

٢٠٢٠/٣/٢١

بـــرا واز له جه‌ژن بێـــنن ئـــاگری نه‌وروز مه‌که‌نه‌وه
تـــاکو ده‌کـــرێ دڵ ومـــاڵ وگیرفـــان گه‌رم بـــکه‌نه‌وه
جه‌ژنـــی چـــی پرســـه‌یه بـــرا له‌م کـــات وســـاته ئـــاڵۆزه
چۆن هه‌ست ودڵ رێگه‌ت ده‌دا بۆ گه‌شت وجه‌ژنه پیرۆزه

٢٠٢٠/٣/٢١

کـــــــۆلان به کـــــــۆلان جـــــــاده به‌جـــــــاده
کرۆنـــــــا ده‌گه‌رێ خـــــــۆتی لـــــــێ لاده
ده‌رگه‌ی مـــــــاڵ داخه ومه‌چـــــــۆ ده‌ره‌وه
هـــــــاتووچۆی خزمـــــــان له‌بیـــــــر به‌ره‌وه
که‌ی په‌تـــــــا نه‌مـــــــا به‌ســـــــه‌ریا زاڵ بـــــــووین
گـــــــه‌ی بـــــــکه‌ن ئه‌گه‌ر له‌مـــــــاڵ بـــــــووین
ده‌پـــــــارێینه‌وه خـــــــودای به‌خشـــــــنده
بمانپـــــــارێزی له‌م ده‌رده کوشـــــــنده

٢٠٢٠/٣/٢٢

ئەوکەســـــــــــەی پـــــــــــارەی ئەم گەلەی لایە

چـــــــۆنی بـــــــــردووە لە کــــــــوێی دانــــــــایە

گەر لەم پێویســـــــــــــتیە نەیهێنـــــــــــتە دەرێ

خـــــــــــوایە کۆڕونــــــــــــا لەنـــــــــــاوی بەرێ

٢٠٢٠/٣/٢٣

فەرمـــــــــــــــانبەری حـــــــــــــــــوکمەتی

بەبێجــــــــــــــامەی خەت خەتــــــــــــــــــی

لە مــــــــــــاڵێ بە پێــــــــــــــی پەتـــــــــــــی

هەردەم جــــــــــــــــرت فرتیەتــــــــــــــــی

چــــــــــــــــاوەڕێی مـــــــــــــــــوچەیەتی

٢٠٢٠/٣/٢٤

## رۆژتان باش

رۆژتـــان بـــاش، مامۆســـتای بەڕێـــز وبـــاش

دانیشـــن ، ئـــاخ مامۆســـتای بـــێ معـــاش

ئـــــــــۆی ئـــــــــۆی دۆی دادە هەروا دەرژێ

مامۆســـتاش وەک نـــانی ســـاج دەبـــرژێ

٢٥ / ٣ / ٢٠٢٠

## فەرمان

ســـــــــەرچاو فەرمانـــــــــت رۆنە

کەرەنتـــــــین بـــــــۆ کـــــــۆرۆنە

بەس لەمـــــــاڵیش بـــــــڕۆنە

بـــــێ گۆشـــــت و شـــــەکر و ڕۆنە

مـــــــــردین بە مەعکـــــــــەڕۆنە

٢٠٢٠/٣/٢٦

( عەوڵەسیس)ی قارەمان، ( ئەحمەد دەسماڵ ) ی دانا
دووچـــــایەچی نەبەرد و شۆرشـــــگێڕ و بەتوانـــــا
(عەوڵ) گیـــانی بەخـــت لەرێـــگەی کوردســـتانا
(دەســماڵ) کــاتی پێشــەوا نــاوی پێشــمەرگەی دانــا

(عەوڵە ســیس) لە(٦)ی ئەیلــول ١٩٣٠ یەکێــک بــوو لە رێکخەرانــی
خۆپێشاندانەکەی بەردەرکی سەرای سلێمانی ، یەکێک لە ئنگلیزەکان
تەقەی لە خۆپێشاندەران کردووە ونزیکەی ١٢٠ کەسی کوشتووە
عەوڵە سیس بە خەنجەرەکەی هێرشی بۆ دەبات ئەو کەسە دەکوژێت
ئەحمەد دەسماڵ\ چایەچی پێشەوا قازی محمد بـوو لە کۆبـونەوەیەک
ساڵی ١٩٤٧ لەگەڵ هێـزی چەکدار دەیەوێـت ناوێـک بـۆ هێـزی چەکدار
دابنێـت ئەوانـیش لەبیرکـردنەوە وگفتوگـۆدادەبن ونەحـمەد دەسـماڵی
چـایەچیش لەکـاتی چاهێنانـا ئاگـای لـێ دەبـێ ئەمـیش دەڵـێ گەورەم
(پێشمەرگە) باشە بۆ ئەم مەبەستە.

٣١ / ٣ / ٢٠٢٠

ئەگەر ســـــــــــەركەوتی ئەگەر بــــــــــدۆڕێی
گرنـــــــــگ ئەوەیە لە خـــــــــۆت نەگـــــــــۆڕێی

٢٠٢٠/٤/١

كە لە مووچەی خانەنشینیم سەدابیست ویەكیان بـڕی
بەرەو بیست و یەك تیشكەكەی ئاڵاكەم سەرم هـەڵبڕی
وتم ئۆخەی بیست ویەك بوو پەنجا نەبـوو بەخـتم هەبـوو
دەنا خۆ سـەدا پەنجـا بـا مـووچەكەمی دەكـرد بە مـوو

٢٠٢٠/٩/٧

خۆشە ئـاوێنەك پەیابـا كە ناپـاك سـەیری خـۆی كردبـا
رووی وەك بەری سێر ڕەشـكردباو یەك تفـی خەسـتی لـێ كردبـا

٢٠٢٠ / ٩ /٧

سەیرە لە کارگەی پێلاوبی ودەوام بکەی بە پێ خواستی
خاوەن مێگەلێکی مەڕ بی وبچیە ماڵان لەبۆ ماستی

٢٠٢٠ / ٩ / ٧

قسەوکرداری ئەمرۆکە چەشنی مۆزە هەمووی خوارە
مۆز بە خواریش خۆشە و دەخورێ ئەمیان دەڵیی ژەهری مارە
٢٠٢٠ / ٩ / ٧

جوان تێدەگا نابیستێ بە هێمای پەنجە و دەستێ
جێگەی داخە باش بیستێ بەهاواریش نەبیستێ

٢٠٢٠ / ٩ / ٨

لە ژووری گشت بەرپرسەکان هەڵبواسن وێنەی گۆڕێ
تامردنی هەر لە یاد بێ و سەرڕاست بێ لە خۆی نەگۆڕێ

٢٠٢٠/٩/٩

هەتا پەنجەی دەست لێك دووربن بەبست
شکانی ئاسانە وقەت نابێ بە مست

٢٠٢٠ / ١٠ / ١٧

کورد یەک هێزبێ دوژمن ئالای بۆ هەڵدەدا
تەبا نەبن هەروا ئاگری تێ بەردەدا

٢٠٢٠ / ١٠ / ١٨

زووبن میللەت ئاشت کەنەوە بـبن بە یەک هێـزو وتـار
وریـابن دوژمنمـان زۆرە زۆر ئاسـانە شەشـی ئـازار

١٨ / ١٠ / ٢٠٢٠

بـــــــــا عەمەل بیـــــــــێ بە عەلەم
تـــــــاگەل بـــــــــژی بەبـــــــــێ ئەلەم

١٩ / ١٠ / ٢٠٢٠

سـەیری پەپـولەی بـێ دڵ چـۆن لێـوی گـوڵان دەمـژێ
مخـابن زۆر خـاوەن دڵ هەسـتی وەک گـوڵان دەکـوژێ

٢١ / ١٠ / ٢٠٢٠

دڵ هێنـدە تـاریکە دەڵێـی پـێش کـاتی مـام ئەدیسـۆنە
لە هەرێمێکـی بـێ مـووچە وبـێ کـار و پـڕ لە کـۆڕۆنە

٢٢ / ١٠ / ٢٠٢٠

کە بــــووی چــــۆن بــــڕی ژیــــان دەبــــڕێتەوە
هەر چــــــاکە وپــــــاکی دەدرەوشــــــێتەوە

٢٢ / ١٠ / ٢٠٢٠

گوڵ مێژوی بەگوڵ دەنووسرێ وگـۆڕی دەرشـێنن بە گـوڵاو
دڕک و گەنـدەڵ دوای نەفـرەت بە بۆیـاغی رەشـی پـێڵاو

٢٣ / ١٠ / ٢٠٢٠

ژیـانی ئەمـڕۆی گەل کـوردا کـوردێ وێنـای نـەدەکرد
سەرسام بووە درشت ووردا شۆرش وخەباتمان بۆ کرد

٢٤ / ١٠ / ٢٠١٠

جـــــوانی بـــــۆ کوردســـــــتان بــــێ
ناپــــــاك جێـــــی گۆڕســــــــتان بــــێ
مـــــان و ســــــەربەرزی بـــــۆ گـــــەل
مـــــــــردن بـــــــــۆ دزو گەنـــــــــدەڵ
٣٠ / ١١ / ٢٠٢٠

کوردســـتانم لـــەدڵمای زۆر شـــیعرم بـــۆ نووســـیوی
لەوەتـــەی مـــن دەفـــامم ئـــاوا زەبـــون نەمـــدیوی
٣٠ / ١١ / ٢٠٢٠

کـــــــە دڵنیـــــــــای تـــــــۆ هـــــــەردەمری
بــــــۆ ڕێگـــــــەی ڕاســــــــتی نـــــــاگری
مـــــاڵی دونیـــــــا چەنـــــــد هـــــــەڵگری
پولێـــــــك نابـــــــەی بـــــــۆ ناوقـــــــەبری
لێــــــرەش نـــــــەتگرن خـــــــوا دەتگـــــــری
یەکســـــــەر بـــــــۆ جەرگـــــــەی ئـــــــاگری
١ / ١٢ / ٢٠٢٠

سـەربەرزبە هێنـدەی کۆشـکت بـراوەی لێرەولـەولادا
لێرە لـەدڵی میللـەت دەژی لـەولاش لەسـایەی خـوادادا
٢٠٢٠ / ١٢ / ١

ئۆف نیشتمان مێشکی گشـتمان والەعەشـقت بـەتاڵ دەبـێ
بـۆ وتنـەوەی ئـەی ڕەقیبـیش زمـان سـڕ دەبـێ و لاڵ دەبـێ
زۆر دڵتــەنگم بــۆ میللــەتم کەلەســایەی کــورد وابــژی
تـاوانێکی چەنـد گەورەیـە خـەمی مووچـەو ژیـان بتکـوژی
٢٠٢٠ / ١٢ / ٢

تێکچووم یان کەوتوومە گومـان دەبـێ حوکمـەتی کـورد کـوردبن
ئەگـەر کـورد بـن چـۆن دڵیـان دێ گـەلی پۆلایـان وا وردبـن

٢٠٢٠ / ٢ / ٣

تـــۆ بـــەڕەنجی مامۆســـتا
وا لەســـەر کورســـی ئێســـتا
بـــێ وەفـــا بـــۆ ناپرســـی
لەمامۆســـتای ســـك برســـی

٤ / ١٢ / ٢٠٢٠

ڕاستی و پـاکی و پـەروەردە
دەرمـــانی گـــەلی کـــوردە

٤ / ١٢ / ٢٠٢٠

## وەرە حکومەت

وەرە حکومـەت لەبـەر خـوێنی شـەهیدو لانـەوازان
بۆ جەرگەی گەل بەسبێ ترازان بۆ یەکدڵی و بۆ سازان
دڵی گەل خۆشکەن بە خزمەت بەکارو مووچەو نازان
دەی ئازاو بوێربن بۆ ئاشتیش چۆن بۆ جەنگ وشەڕ ئازان
ئێـوە ئاڵقـەو گـەل نـارنجۆك كارەسـاتە لێـك تـرازان

٦ / ١٢ / ٢٠٢٠

خـۆت و پلـە پـارە دەڕۆی دەمێنـێ كـورد و كوردسـتان
خۆزگـەم بـەوەی لـەدڵان دەژی و گـۆڕی چرایـە لەگۆڕسـتان

١٢ / ١٢ / ٢٠٢٠

ئـەو ئاڵایـەی بـە (ئـەی ڕەقیـب) هـەڵكرا لەمـەهاباد
حەیفە ئـەمڕۆ چارەنووسـی كەوتۆتـە دەسـتی بەغـداد

١٦ / ١٢ / ٢٠٢٠

درۆ بویتـــە دەواری ژیـــان
دەوار نشـــینی دڵ پـــڕژان
بـــەهیوای دەواری ڕاســـتین
شەیدای پاكی و خۆشەویستین

٢٧ / ١٢ / ٢٠٢٠

تیشکی ئالاو برینی مووچەو سالی نوێ
بیستویەکن ، بیستویەك ئاخیان دەوێ

٢٠٢٠ / ١٢ / ٢٧

سەری سالەو کەم هەن بەدڵ بگرژێ
سەری سالەو جامی خەممان لێی دەڕژێ
سەری سالەو هیواو ئاوات دەپرژێ
سەری سالەو جەرگ و دڵ وا دەبرژێ

٢٠٢٠ / ١٢ / ٢٩

سەری سالەو هەست و دڵ و زمان سڕی
زۆر ئەستەمە پیرۆزبایی دەربڕی
بەبێ دەنگی فرمێسکی دڵ دەسڕی
لە سووچێکا دادەمێنێ ی بەکڕی

٢٠٢٠ / ١٢ / ٢٩

چرای پەروەردە مامۆستا بالدار
دارا دلتەنگە دەسوتێنن دار
گەل نەوتی نیە ئەمسالیش وەك پار
وابڕوا دارا نابینێ دوو دار

٢٠٢٠ / ١٢ / ٢٩

هـەموو سـاڵ دەڵێـین سـاڵی نـویێ دابـێ
ئـەم گەلـە شـادبێ و چـی دەویێ وابـێ
کـە جێگـەی داخـە سـاڵ دیێ وانـابێ
هـەموو چـاوەڕێین ئـەم ژیانـە چـابێ
خوایـە کوردسـتان گـەش و ئـاوابێ

٢٠٢٠ / ١٢ / ٢٩

لەبوونـــــەوە کوردســـــــتانم
لەناوخــــەم و تـــــەمای گیــــانم
لەســــاڵی نـــویێش مـــن نـــازانم
چـــۆن دەبـــی تیشـــکی چـــاوانم

٢٠٢٠ / ١٢ / ٢٩

زۆر ســـوپاس بـــۆ بـــرای بەڕێـــزم کـــاک ســـۆران عەبدولڕەحمان تاودەر بەڕێوەبەری چاپخانەی شەهاب و گشــت کارمەنــدانی چاپخــانە کە هەردەم هانــدەرو هاوکارمــانن بــۆ چــاپکردنی بەرهەمەکانمــان هیــوای ســاغی و شــادی و بەردەوامــی و ســەرکەوتنیان بــۆ دەخوازین لە ژیان...

کازم کۆیی
٢٠٢١/١/٧

# بەرهەمە چاپکراوەکانی شاعیر

١. دوای راپــەرین، ١٩٩٤، هــۆنراوە لەســەر بــارودۆخی ئەوکات.
٢. کەوەکەم، ١٩٩٤، هۆنراوەی منداڵان.
٣. هەڵۆ، ١٩٩٦، هۆنراوەی منداڵان.
٤. جۆلڵانە و سێدارە، ١٩٩٦، هۆنراوەی جیاجیا.
٥. گوڵزاری منداڵان، ١٩٩٨، هۆنراوەی منداڵان.
٦. ساڵنامەی کوردی، ٢٦٩٨.
٧. ساڵنامەی کوردی، ٢٦٩٩.
٨. ساڵنامەی کوردی، ٢٧٠٠.
٩. ئامۆژگاری و هێماکانی هاتوچۆ، ٢٠٠٠.
١٠. منداڵی ژیر، ٢٠٠٠، پۆستەر، هۆنراوە.
١١. گەشتی دارستان، ٢٠٠٠، ب١، هۆنراوەی منداڵان.
١٢. پۆستەری کوتانی پزیشکیی تایبەت بە دایک و منداڵ، ٢٠٠٠.
١٣. تەرمی تیشک، هۆنراوە، ٢٠٠٠.
١٤. مافەکانی منداڵ، ٢٠٠١، پۆستەر، هۆنراوە.
١٥. ساڵنامەی کوردی، ٢٧٠٢.
١٦. گەشتی دارستان، ٢٠٠٠، ب٢، هۆنراوەی منداڵان.
١٧. هەندەران و هەواری من، ٢٠٠٣، هۆنراوە.
١٨. چەتری هەناسە، ٢٠٠٣، هۆنراوە.
١٩. مافەکانمان، ٢٠٠٣، پۆستەر، هۆنراوەی منداڵان.
٢٠. شــانۆی ژیــان، ٢٠٠٣، پۆســتەر، هــۆنراوە تایبــەت بــە کەمئەندامان.

٢١. قوتابی و هاتوچۆ، ٢٠٠٣، هۆنراوە و ڕێنمایی بۆ منداڵان.
٢٢. ساڵنامەی کوردی، ٢٧٠٤.
٢٣. گەشتی دڵان، ٢٠٠٤، هۆنراوە.
٢٤. ئۆپەرێتی تالاسیما، ٢٠٠٤، هۆنراوە.
٢٥. ساڵنامەی کوردی، ساڵی ٢٧٠٥.
٢٦. هاواری هەست، هۆنراوە، ٢٠٠٥.
٢٧. ئاوێنەی شارستانی، ٢٠٠٥، هۆنراوەی منداڵان.
٢٨. خۆشەویستەکانم، ٢٠٠٥، هۆنراوەی منداڵان.
٢٩. بخوێنن، ٢٠٠٥، هۆنراوەی منداڵان.
٣٠. تیشکی ژیان، ٢٠٠٥، هۆنراوەی منداڵان.
٣١. مۆمی پەپوولەکان، ٢٠٠٥، هۆنراوەی منداڵان.
٣٢. دیوانی نەوەکانی چریکەی دوارۆژ، ٢٠٠٦، هۆنراوەی منداڵان، کۆکراوە، چاپی یەکەم.
٣٣. ساڵی کوردی، ٢٠٠٦، هۆنراوەی منداڵان.
٣٤. توانەوە، ٢٠٠٧، هۆنراوە.
٣٥. دیوانی نەوەکانی چریکەی دوارۆژ، ٢٠٠٧، هۆنراوەی منداڵان، کۆکراوە، چاپی دووەم.
٣٦. ئاوازی خەو، ٢٠٠٧، هۆنراوە.
٣٧. سۆمای هەست، ٢٠٠٧، هۆنراوە، کۆکراوە.
٣٨. بەزم و ڕەزمی منداڵان، هۆنراوەی منداڵان، مامۆستای هونەرمەند (ئامانج غازی)، بە نۆتەو مۆسیقا و هەردوو ڕێنووسی کوردی و لاتینی ئامادەی کردووە، ٢٠٠٧.
٣٩. ساڵنامەی کوردی، ٢٧٠٨.
٤٠. یاریی بەسود بۆ منداڵان، ٢٠٠٨، پۆستەر.

٤١. کاوەو نەورۆز، ٢٠٠٨، هۆنراوەی منداڵان.
٤٢. ڕێوی و گورگ و تەڵە، ٢٠٠٨، هۆنراوەی منداڵان.
٤٣. سروشتی جوان، ٢٠٠٨، هۆنراوەی منداڵان.
٤٤. وتەی درەخت، ٢٠٠٨، هۆنراوەی منداڵان.
٤٥. سروودی خۆشەویستی خوێندن، ٢٠٠٩، هۆنراوە، تایبەت بە قوتابخانەکان.
٤٦. زەنگوڵەی کاریلەکان، ٢٠٠٩، چیرۆکی منداڵان.
٤٧. شانۆی دەنگە ناسکەکان، ٢٠٠٩، هۆنراوەو ئۆپەرێت بۆ منداڵان.
٤٨. ئازاری فام، ٢٠١٠، هۆنراوە.
٤٩. ژانی بێ ژوانی، ٢٠١٠، هۆنراوە.
٥٠. ئازاری فام و ژانی بێ ژوانی، ٢٠١١، هۆنراوە، کۆکراوە.
٥١. سایەی زانین، ٢٠١١، هۆنراوەی منداڵان.
٥٢. پیاسەیەک و هەناسەیەک، ٢٠١٥، هۆنراوە، کورتەیەک لەژیاننامە، کاروچالاکیەکان.
٥٣. بەهای ناخ، ٢٠١٨، هۆنراوە.
٥٤. تا هەی گوڵ بە، ٢٠١٨، هۆنراوە.
٥٥. دڵ و ژیان، ٢٠١٩، هۆنراوە.
٥٦. ئاخ کوردستان، هۆنراوە، ٢٠٢١،

. بەهیواین جێگەی ڕەزامەندیتان بێت... لەگەڵ ڕێزمدا.

کازم کۆیی

٢٠٢١/١/٧ هەولێر

# نووسەر لە چەند دێڕێکدا

- ناو: کازم عەبدوڵڵا توفیق
- ساڵی لەدایک بوون: شاری کۆیە - ١٩٥٧
- ساڵی (١٩٧٣-١٩٧٤) ئامادەیی پیشەسازیی تەواو کردووە.
- ساڵی(١٩٧٤) وەک فەرمانبەرێکی حکومی دامەزراوە.
- ئێستا مامۆستای (کارنشین) (خانەنشین)ە لە (٢٠٢٠/٢/٢)ەوە.
- ئەندامی یەکێتی نووسەرانی کوردە - لقی هەولێر
- ئەندامی سەندیکای رۆژنامەنووسانی کوردستان.